ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

# وتاری فیکریی سیاسی

# کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامی

## ٣٠ / ٥ / ٢٠١٥

عەلی باپیر

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ناوی کتێب : وتاری فیکریی سیاسیی کۆنگرەی سێ یەمی کۆمەڵی ئیسلامیی

نووسەر : عەلی باپیر

بەرگ : عزالدين محمد عمر

دیزاین : عزالدين محمد عمر

ساڵی چاپ : ٢٠١٦ ز – ١٤٣٧ ك

تیراژ : (١٠٠٠) دانە.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٤٥٩)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێ دراوە

# پێشەكی

الحمـدلله رب العالـمين، والصـلاة والسـلام والبركـات علـى محمـد النبـي الخـاتم المبعـوث رحمـة للعالـمين، وآلـه أجمعـين، مـن الصـحب والأزواج والقرابـة والتـابعين لـهم بإحسـان إلـى يـوم الدين.

بەڕێـزان!

خوشك و برایانی خۆشەویستم!

مشورخۆرو دڵسۆزانی كـاروبەرۆژەی ئیسـلامیی لـەبازنـەی كۆمـەڵی ئیسـلامییدا.

ئەوەی بەردەستتان دەقی وتارەكەی بەندەیە، كەلە كۆنگرەی سێیەمی كۆمەڵی ئیسلامییدا پێشـكەشم كـرد، كـە لـە ڕۆژانـی: (٣٠و٣١/ ٥و ١/ ٦/ ٢٠١٥)دا بەسـترا.

هیوادارم بە وردیی بیخوێننەوەو، لە هەموو ڕوویێکەوە مایەی بەهرەمەندبوون‌و بەرچاو ڕوونبوونەوەتان بێ، لەم ڕۆژگارە پڕ گرفتاریی‌و تەنگ‌و چەڵەمەی جۆراوجۆرو ئێش‌و ژان‌و نارەحەتییەدا.

هەمووﻻیەکیشتان دڵنیا دەکەمەوە کە تەنگانە بەری کورتە، پاش هەوراز نشێوەو، خۆڕاگریی‌و نەلەخشاوییمان لەسەر ڕاستەڕێی ئیسلام‌و، پابەندییمان بەیاساکانی شەریعەت‌و، ڕازانەوەمان بەڕەوشت‌و ئاکارە بەرزو پەسندەکانی، دەستەبەرکەری سەرکەوتن‌و سەربەرزیی دنیاو، سەرفرازیی‌و بەختەوەریی ڕۆژی دوایی مانن.

١١/ ڕەمەزان / ١٤٣٧ک
١٦/ ٦ / ٢٠١٦ز
هەولێر

ئامادەبووانی بەڕێز، برایان و خوشکان!

السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ

بێگومان کۆنگرە، ئەم کۆنگرەی سێیە، وە هەر کۆنگرەیەکی دیکە، بۆ ئێمەی مسوڵمان و ئیسلامیی، بەرجەستە کردنی فەرمانی خوایە، کە دەفەرموێ:

﴿ ... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى

واتە: کاروباری مسوڵمانان دەبێ بە ڕاوێژو پرس و ڕا بە یەکدی بێ.

لە ئیسلامدا هیچ کەس سەرچاوەی دەسەڵات نیە بەتەنیا، بەڵکو مسوڵمانان هەموویان خاوەنی دەسەڵاتن، هەموو دواندنەکانی قورئانی خوای پەروەردگار تێیاندا ڕوو دەکاتە خەڵك، وە ڕوو دەکاتە ئەهلی ئیمان، ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، وە کۆنگرە وێستگەیەکە بۆ چاو بەخۆدا گێڕانەوە: لە ڕابردوودا چیمان کردوە؟ ئەو هەوراز و نشێوانەی بڕاون، چەند تێیاندا سەرکەوتوو بووین؟ لە کوێدا شکستمان هێناوە؟، لە کوێ کرچ و کاڵیی و هەڵەمان هەبووە؟ کە پێویست دەکا چاوی پێدا بگێڕینەوەو چاکی بکەین.

هەروەها کۆنگرە ، بەرنامەو نەخشــە دانانە بۆ ڕابردوو .

لێرەشەوە من دەمەوێ یــادی هەموو ئەو بەڕێزانە بکەمەوە کە لەم کــارو کاروانەدا ، لە ڕابردوودا بەشدار بوون ، بە تایبەت ئەوانەی بەرەو ڕەحمەتی خوا چوون ، چ ئەوانەی کە شەهید بوون ، چ ئەوانەی بە مردنــی ئاســایی مردوون ، هەموویان بە ئێکڕا ، بەتایبەت بــرای بــەڕێزمان مامۆســتا شــێخ موحەممەدی بەرزنجی ، پێشــەوای کۆمەڵی ئیســلامیی ، هەروەها مامۆستای ناوداری کوردستان : مامۆستا شێخ صــدیقی سەرگەتیی ، هەروەها باقی بــرا ســەرکردەکانی دیکەمان ،مامۆســتا عەبــدوڵڵای قەســریی ، وە چــوار پاسەوانەکەی ، وە مامۆستا ناصــیح ، وە مامۆســتا موحەممــەد ســەنگاویی و کاك صلاح ، وە برا فەرماندەو برا پێشمەرگەکان ، ئەوانەی کە لە مووشەك بارانەکەی ئەمریکادا گیانیان بەخت کرد ، ئومێد وایە خوای بــەروەردگار بە شەهیدی وەرگرتبێ ، وە هەموو ئەوانەی کە لەو کاروانەدا ڕۆیشتوون ، پێش ئیعلانــی کۆمــەڵی ئیســلامیی و دوایــیش ، لــە خــوای بــەروەردگار داواکارین ، بــە باشــترین شــێوە پاداشــتیان بداتــەوە ، کــەم ئەندامــەکان ، بریندارەکان ، کەسوکاری شەهیدەکان ، ڕێزو حورمەتمان بــۆ هــەموویان هەیە ، لە خوای بەروەردگار داواکارین بەباشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە ، وە یارمەتیشمان بدات کە ئێمەش لەسەر ئەو ڕەوت و ڕێبازە بەردەوام بین و ڕێکەبین تاکو ئــاوات و ئامانجەکانی ئەوان کــە دەیانویســت لــە دنیــادا بــۆ خەڵك و میللەتیان بۆ دین و ژینیان ، تەحقیقیــان بکــەن ، بیانهێنینــە دی .

بەڕێـزان !

ئەم کۆنگرەیـە وەك باس کرا، لە هـەل‌و مـەرجێکی ناسـك‌و دژواری هـــەرێمی کوردســتان‌و عێـراق‌و ناوچەکەشــدا دەبەســترێت، بۆیــە پێویســت دەکـا خــوا پشــتیوان بــێ، هـــەموو لایـەك بـە گیــانێکی بەرپرسـانەوە ، بەرپرسـانە بەرامبـەر بـە خـوا سبحانە و تعـالی، ئـەمجار بەرامبەر بە خەڵکی خوا، هەموو کارەکـانی ئەم کۆنگرەیە تەواو بکـەین، مــن هــەوڵ دەدەم قســەکانی خــۆم لــە ســێ تــەوەردا بــە گوشــراویی پێشــکەشــی ئێوە بکــەم :

یەکەمین شت کە دەمەوێ سەرنجی بەڕێزتانی بۆ ڕابکێشم، ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەیە کە لە جیهانی ئیسلامییدا بەڕێوەیە، ئەو شۆڕشانەی کە کران لە: تونس و، لیبیاو، میصرو، یەمەن و، سوریا، وە ئەو جموجۆڵانەی دیکە کە هەن، لە وڵاتانی دیکەی ئیسلامییدا، هەموویان سەرچاوەکەیان ئەوەیە کە خەڵکی مسوڵمان تەماشای دینەکەی دەکاو تەماشای ژینی دەکا، دیقەت دەدا ژینی لە دینی دوور کەوتۆتەوە، میللەتێك و ئۆممەتێکی مسوڵمان، دەبێ ژینی بەپێی دینی بێ، بە شێوەیەك بەڕێوە بچێ کە خوا فەرمانی پێکردوە، بۆ ئەوەی هەم بەختەوەریی دنیاو هەم سەرفرازیی ڕۆژی دوایی، دەستەبەر بکات، ئەو شۆڕشانە دەبێ لەویوە بۆیان بڕوانین، بەڵام هەڵوێستی دوای شۆڕشەکان ئەو کودەتایانەی کە بەسەریاندا کران، ئەو پیلانانەی کە لە دژیان گێڕدران، لە میصر کودەتای سەربازیی کرا، وە لە لیبیاو یەمەن و سووریاو تونس، کێشەی لابەلاو ناکۆکیی دروستکرا، هۆکارەکەی ئەوەیە کە دنیای ئەمڕۆ، بە سەرکردایەتیی زلهێزان، نایانەوێ ئیسلام قەوارەی ڕاستەقینەی خۆی هەبێ، نایانەوێ مسوڵمانان لە ژێر سایەو سێبەری شەریعەتەکەیاندا بژین، بۆیە هەوڵ دەدەن، ئەو هەوڵە ئیسلامییانە لەبار بەرن، ئەوەی میللەتان دەیکەن، هەوڵی خۆڕسکن، دەستیان لە پشتەوە نیە، جگە لە ئیرادەی خەڵك،

بەڵام زلهێزانو ناحەزانی ئیسلام ، هەوڵ دەدەن لەباریان بچوێنن، بۆ ئەوەی خەڵك بەرامبەر بە ئیسلامو تەوژمی ئیسلامیی نائومێد بن، وە پێی وابن کە ئیسلام ناتوانێ گرفتو کێشەکانیان چارەسەر بکات، بەختەوەریی دنیایان بۆ دەستەبەر بکات، بەڵام ئێمە دڵنیاو پشت ئەستوورین بەرامبەر بە دینی خۆمان، ئێمە پێمان وایە کە خوای کاربەجێ، یەکەم مرۆڤ کە ئادەم بوو لەسەر ئەم زەوییە داینا، لەگەڵ هاوسەرەکەی حەواو سەلامی خوایان لێبێ، بێبەشی نەکردن لە هیدایەتو ڕێنموونیی خۆی، بۆ ئەوەی بە شێوەیەك ژیانی سەرزەوی بگوزەرێنن، کە دوایش شایستەی ئەوە بن بگەڕێنەوە ئەو شوێنەی بەهۆی هەڵەو تاوانەوە، لێی دەرکران، کە بەهەشتە، خوای پەروەردگار ئەو شەریعەتانەی ، کە بە پێغەمبەراندا سەلامی خوایان لێبێ، ناردوونی، بۆ ئەوە بووە کە خەڵك ئەم ژیانی دنیاییە بەختەوەرانەو بە ڕێكو پێکیی و پاكو چاك بگوزەرێنن، بۆیە ئەو شەریعەتە خواییە، ئەو وەحییە خواییە، ـ بەتایبەت ئەوەی کە بێ دەستکاریی ماوەتەوە، کە تەنیا قورئانە، شەریعەتی پێغەمبەری کۆتاییە (صلى الله عليه وسلم)ـ هەمیشە پێویستە بۆ ئینسان، ئایا ئینسان هیچ کاتێك لە هەوا بێ نیاز دەبێ؟ هیچ کاتێك لە تیشکی خۆر بێ نیاز دەبێ؟ هیچ کاتێك دەگونجێ پێویستی بە ئاو نەبێ؟؟

بێگومان نەخێر، وەحیی خوای پەروەردگاریش ڕووحە بۆ ژیانی بەشەر، بۆیە من لێرەوە، ئێوە برایان و خوشکانی ئامادەبووی کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامی دڵنیا دەکەمەوە، وە هەموو مسوڵمانان دڵنیا دەکەمەوە، کە ئەم ئایینە هیچ کات کۆن نابێت، بەمەرجێ بە عەقڵێکی سەلیم و واقیع بینانە، وەك خۆی ـ ئەوەی کە وەحییە و لە قورئان و سوننەتی صەحیحدا بەرجەستەیە ـ تەماشای بکەین و ببینین، بەڵێ هەمیشە ئایین پێویستە بۆ ژین، خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (الشوری)دا دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشورى.

خوا قورئانی ناوناوە: ڕووح، هەمیشە جەستە چەند پێویستی بە ڕووحە، ژینیش ئەوەندەش پێویستی بە وەحیی و بەیامی خوایە، ئەگەرنا غەریزەکان و هەواو ئارەزوو بەسەریدا زاڵ دەبن، هەرچەندە لە لووتکەی تەکنۆلۆژیا دابێ، بەڵام تەکنۆلۆژیاکەشی بەکاردێنێ بۆ زەلیلکردنی میللەتان و، بەتاڵان بردنی خێر و بێرو داگیرکردنی وڵاتان وەك ئێستا دەیبینین.

**١/ بە نسبەت گۆڕانکارییەکانی ناوخۆی عێراق و سووریا، وە هەڵتۆقینی (داعش)ەوە:**

دەڵێم: لە ئەنجامی ئەوەدا کە لە سووریا چەند دەیەیەکە ڕژێمێکی تاك حیزبیی دیکتاتۆریی بەسەر خەڵکەوە حاکمەو، کابووسێکی قورسە بەسەر سینگیانەوە، خەڵکی سووریا ڕاپەڕین و لەوێ بیرۆکەی توندڕەویی چەکەرەیدا، کە دوایی لە داعشدا بەرجەستە بوو، هەروەها لە عێراقیش لە هەشت ساڵی ڕابردوودا، بە نەفەسێکی تائیفیی و بە نەفەسێکی بەراوێز کردنی خەڵك، بەڵکو بە هیچ دانانی خەڵك، حوکمڕانیی عێراق دەکرا، تائیفەیەك خۆی بە هەمەکارە دەزانی، نە حیسابی بۆ کورد دەکرد، نە بۆ عەرەبی سوننە، ئیدی لەو بارودۆخە نائاسایی و ناسروشتییەدا، توندڕەویی و بەرگیریی سەریهەڵدا، ئێمە پاساو ناهێنینەوە بۆ هیچ کەسێ، کە لە سنووری شەریعەت دەردەچێ، ئەوەی کە داعش و باقی گرووپە تیرۆریست و بەرگیرەکان دەیکەن، دەرچوونە لە شەریعەت و لەگەڵ شەریعەتدا دژ دەوەستێ، شەریعەتێك کە بۆ ئارامیی و بەختەوەریی خەڵك هاتووە، شەریعەتێك کە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) نازناوی (رَحمَةً لِلعالَمين)ی هەیە، وەك من لە بۆنەیەکی دیکەدا گوتم[1]:

---

١) لەو بۆنەیەدا کە لە (٢٥/ ٣/ ٢٠١٥) لەلایەن پارێزگاری (نینوی)ەوە لەبارەی بارودۆخی عەرەبی سوننە بە گشتی و موسڵ بەتایبەت سازکراو بەشدەش وتەیەکی پازدە خولەکیم، بە عەرەبیی تێدا پێشکەش کرد.

بیکەن بە پێوەر، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء، تەماشا بکەن هەر حیزبێکی ئیسلامیی، هەر گرووپێك، هەر کەسێك هەر ئیدیعایەکی هەبێ، تەماشا بکەن، ئەگەر مایەی ڕەحمەت بوو بۆ خەڵك، (رَحمَةً لِلعالَمين) نەیفەرمووە: (رَحمَةً لِلمُسلِمين)، ئەوە بزانن، کە لەسەر ڕێی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام ئەگەر بووە مایەی زەحمەت و سەرئێشە، نەك هەر بۆ خەڵك، بەڵکو بۆ مسوڵمانانیش و بە کەسی هەڵنەکردو کەسی قەبووڵ نەبوو ـ کە داعش وایە ـ، ئەوە دڵنیا بن کە لە ڕاستە ڕێی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لایداوە.

**٢/ بە نسبەت هەرێم و عێراقەوە:**

دیارە عێراق دوای (٢٠٠٣) کە دروست بۆوە، بە بۆچوونی ئێمە بە لاتەڵیی و لاسەنگیی دروست بۆوە، ئینتیما بۆ نیشتیمان و وڵات لە ئارادا نەما، ئینتیما بۆ تائیفەو بۆ خەڵکێکی دیاریکراو، بۆ هەرسێ پێکهاتەکە دروست بوو، کە ئەمریکا ئەوەی بۆخۆی ناوێ، لەوێ خەڵك ئینتیمای هەیە بۆ وڵاتەکە، بەڵام لێرە خەڵك فێری ئەوە کرا، کە هەرکەسە ئینتیمای هەبێ بۆ تائیفەو شوێنی خۆی، ئنجا لەوێوە چەکەرەی ئەو ئاژاوەو دووبەرەکییە ڕووا.

ئێمە پێمان وایە:

أ- یان دەبێ بەغدا بە شێوەیەکی باش مامەڵە لەگەڵ هەرێمدا بکات، چونکە ئەم هەرێمە بەپێی دستوور دروست بوو، وە ئەوە لای کەمی مافی ڕەوای میللەتێکە، وە دەبێ بەغدا چاو بە هەڵەکانی خۆیدا بگێڕێتەوە، ناشڵێین هەرێم بێ هەڵەیە، هەرێمیش دەبێ شەفافانەترو ڕوونتر مامەڵە لەگەڵ بەغدادا بکاتو، نابێ گلەیی بێنێتە سەرخۆیو بیانوو بداتە دەست ناوەند.

ب- یان دەبێ بیرێکی دیکە بکرێتەوە، ئەگەرنا بەو شێوەیە بەردەوام بوون، هەم لە زەرەری عێراقیشە وەك دەوڵەت، هەم لە زەرەری هەرێمی کوردستانیشە وەك هەرێم.

**٣/ بەنسبەت وڵاتانی دراوسێوە :**

ئێمە وەکو کۆمەڵی ئیسلامیی پێمان وایە، ئەو چوار نەتەوەیە کە لەم ناوچەیەدا هەن، کوردو، عەرەبو، تورکو، فارس، هیچ کامیان بە ئیرادەی ئازادانەی خۆیان نەهاتوونەتە ئێرە، وە ناشتوانین ماڵەکانمان بگوازینەوە، بۆیە هیچ چارمان نیە دەبێ بەیەکەوە تیدا بین، پێکەوە گونجاو بین، وەمن لێرەوە ڕوودەکەمە هەرسێ نەتەوەی دراوسێ: عەرەبو تورکو فارس، کە ئەوەی بە خۆیانی ڕەوا دەبینن، بەو گەلە دراوسێیەی خۆشیانی ڕەوا ببینن، ئەگەر خۆتان دەوڵەتتان هەیە، لانی کەم با گەلی کوردیش ئۆتۆنۆمییەکی

ڕاستەقینەی هەبێ، یان هەرێمێکی هەبێ، چونکە تۆ چیت بۆخۆت بێ چاکە، دەبێ ئەوەت بۆ برای مسولمانیشت بێ چاك بێ، ئەگەر مسولمانی!

ئنجا ئەگەر باسی مافی مرۆڤ و دیموکراسیش دەکەن، بەهەمان شێوە دەبێ ئەو کەسانەو ئەو نەتەوانەی کە یەکسانن، مامەڵەی یەکسانیان لەگەڵدا بکرێ، خوای کاربەجێش کە دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات، وە بە تەئکید ئێمە دەبێ لەو ناوچەیەدا ڕێز لە یەکدی بگرین، دەبێ هێمنیی و ئاسایشی هەرکام لەم وڵاتانە بە هی خۆمان بزانین، وە دەبێ ئەوانیش هێمنیی و ئارامیی ئێمە بە هی خۆیان بزانن، وە دەبێ بگەڕێین بۆ خاڵە هاوبەشەکان و بۆ بەرژەوەندییە هاوبەشەکان.

هەر لێرەوەش باسی ئەو ئاشتییە دەکەم کە لە تورکیا لە ئارادایە، کە جێگای دڵخۆشییەو هەردوولا: هەم دەوڵەت هەم کورد لە باکووری کوردستان، پێویستە بە هیچ هۆکارێك لەم ئاشتەوایە سارد نەبنەوە، چونکە هیچ بەدیلێکی دیکەیان نیە، لەماوەی ڕابردوودا ئەزموون کرا: یەکدی کوژیی و سەنگەر لە یەکدی گرتن، بەڵایەکە بۆ هەردوولاداو برینێکە لە هەردوولاو، خوێنێکی زۆر لە هەردووك لا

دەڕوا ، وە سەرەنجامیش هیچ چاریان نیە دەبێ دابنیشن لەسەر مێزی گفت‌و گۆ ، بۆیە من لێرەوە بەناوی کۆنگرەوە دەڵێم : پێویستە لە تورکیا پرۆسەی ئاشتیی تەبایی‌و چارەسەری کێشەکان بە گفت‌و گۆ ، بە هیچ شتێکی دیکە نەگۆڕدرێتەوە ، وە بیر لە هیچ شتێکی دیکە نەکرێتەوە ، دیارە ئەوەش لەسەر بناغەی دادگەریی‌و ، ئەوە کە چیت بۆخۆت بێ ڕەوایە ، بۆ ئەوی دیکەشت بێ ڕەوا بێ .

**٤/ بە نسبەت دەوڵەتی کوردستانەوە، لە باشووری کوردستاندا :**

وەك باسم کرد : ئەگەر ئێمە لەگەڵ بەغدا بگەینە ئەنجامێکی باش‌و بەیەکەوە بژیەین ، بە شێوەیەکی وا کە بۆ هەردوولا جێگای خۆشحاڵیی بێ ، ئەوە زۆر چاکە ، ئەگەرنا گەلی کورد حەقی خۆیەتی ، لەم باشووری کوردستانەدا بەرەو سەربەخۆیی بڕوا ، بەڵام سەربەخۆیی‌و ڕاگەیاندنی دەوڵەت ، بە قسەی خۆش‌و درووشم‌و شیعار نابێ ، دەبێ زەمینە سازیی بۆ بکریٔ‌و پێشەکییەکان باش هەڵچنین ، بۆ ئەوەی ئەنجامێکی باشیان بەدوادا بێت : ژێرخانی ئابووریی ، تەبایی سیاسیی ، هێزێکی پێشمەرگەی نیشتیمانیی ، بە دامەزراوەکردنی کارەکان ، دەستوورێك کە مەرجیع بێت‌و کێشەکانمان بۆ یەکلایی بکاتەوە ، وە دیپلۆماسییەتێکی یەکگرتوو ، کە تەعبیر بکات لە ئیرادەی خەڵکی هەرێمی کوردستان ، نەك لە ئیرادەی حیزبێك ، هەموو ئەوانە پێویستن ، ئەگەر بیر لە

سەربەخۆیی بكەینەوە، دیارە لە بەشەكانی دیكەی كوردستانیشدا ئێمە وەكیلی ئەوان نین، هەركەسە بۆخۆی دەزانێ چۆن ئەو مافانەی خۆی دەستەبەر دەكات، گرنگ ئەوەیە كورد وەك هەر گەلێكی دیكە، مافی خۆیەتی لە خاكی خۆی و لە نیشتیمانی خۆیدا سەربەرزانەو سەربەستانە بژیەت، ئنجا ئەو مافەی خۆی لە ئۆتۆنۆمیی ڕاستەقینەدا دەبینێتەوە، لە هەرێمێكدا دەیبینێتەوە، لە دەوڵەتێكی سەربەخۆدا دەیبینێتەوە، نابێ هیچ كەس نكوڵیی لەو ڕاستییە بكات، وە دەبێ دانیان پێدا بهێنرێ.

**٥/ چاكسازیی لە هەرێمی كوردستاندا:**

ئەو چاكسازییەی كە بڕیار بوو بكرێ، نەكراو ئاستەنگ و لەمپەری هاتە بەردەم: شەڕی داسەپاوی داعش، قەیرانی ئابووریی، پاشان كەم ئیرادەیی لەلایەن ئەو كەسانەوە كە دەبێ چاكسازیی بكەن، بەداخەوە كە پرۆسەی چاكسازیی زۆر دواكەوت، بەڵام ئێستاش ماوە، ماوە، با درەنگ نەكرێ، وە كارێك نەكرێ خەڵكی هەرێمی كوردستان تووشی نائومێدیی بكرێ، وە پێی وابێ كە: نەهێشتنی فۆرخكاریی و، گەندەڵیی و، هەیمەنەی حیزب، وە بە دامەزراوەكردنی كارەكان و، یاسا سەروەریی، گرێیەكە بەكەس ناكرێتەوە!

ئێمە ئەگەر ئیرادەی ڕاستەقینەمان هەبێ، وە لە کەوڵی بەرژەوەندیی تاکەکەسیی و حیزبیی بێینە دەر، بۆ فەزای فراوانی نیشتیمان پەروەریی و خزمەتکردنی خەڵك، بەدڵنیاییەوە دەتوانین چاکسازیی ڕاستەقینە بکەین لە وڵاتی خۆماندا.

مەسەلەی حکوومەتە خۆجێییەکان لە پارێزگای سولەیمانی، هەندێك لە کارەکان باش بەڕێوەچوون، ئومێدەوارم تەواو بکرێن و لە پارێزگاکانی دیکەش ئومێدەوارم کە حکوومەتە خۆجێییەکان بچەسپێن، چونکە ئەوە شتێکی زۆر باش و شارستانییە، بەرتکردنی دەسەڵاتە، کە ئێمە هەمیشە کوشتەی چڕکردنەوەی دەسەڵات بووین، بۆیە ئەگەر دەسەڵات بڵاوبکرێ، نزیکترە لە ئازادیی و لە ئیرادەی خەڵکەوە، بۆیە پێویستە حکوومەتە خۆجێییەکان دەستی باشتریان لێ بجووڵێنرێ.

٦/ **پەیوەندییەکانمان :**

أ- ئێمە پەیوەندییمان لەسەر ئاستی نیشتیمانیی: لەسەر ئەو بناغەیە کە هەموومان لە کەشتییەك داین و، دەبێ ڕێز لەیەکدی بگرین و بەیەکەوە هاوکاریین و بۆ یەکدی دڵسۆز بین، لەسەر ئەو بناغەیەش لەگەڵ هەموو لایەنەکانی دیکەی هەرێمی کوردستان و دەرەوەی هەرێمی کوردستانیش، پەیوەندیی خۆمان بنیات ناوە.

ب- لەسەر ئاستی تەوژمی ئیسلامیی ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی، هەمیشە دەستپێشخەر بووین بۆ هاوکاریی و نیزیکی لەگەڵ هەموو پێکهاتەکانی تەوژمی ئیسلامییدا: یەکگرتووی ئیسلامیی لەپێش هەموویانەوە، ئنجا بزووتنەوەی ئیسلامیی، تەوژمی سەلەفیی، تەوژمی ئەهلی تەریقەت و تەصەووف، کەسایەتییە ئیسلامییەکان، مامۆستایانی بەڕێزی ئەهلی مینبەرو میحراب، ئێمە هەوڵمان داوە لەگەڵ هەموویاندا باشترین پەیوەندییمان هەبێ، چونکە سەرئەنجام خۆمان لە یەك چوار چێوەدا دەبینینەوەو خۆمان بە ئەهلی ئیسلام دەزانین و، هەمووشمان ڕێبواری یەك ڕێین، بۆیە هەمووشمان دەبێ تەواوکەری کاری یەکدی بین، وە ئەم ئیسلامە مەزنە، وە ئەم خەڵك و وڵاتە هیچ کاتمانی لێ زیاد نیەو هەموومانی پێویستە، بەڵکو دەبێ خۆمان چاکترو زیاتریش بکەین، بۆ ئەوەی کە بەپێی پێویستیی ئەو خەڵك و وڵاتەی خۆمان بین.

### ٧/ پەیامێك بۆ پێشمەرگەو ئاسایش و پۆلیس:

دەمەوێ پەیامێك بۆ برا پێشمەرگەکان بنێرم، هەروەها بۆ ئەوانەش کە لە بواری ئاسایش و پۆلیسیشدا کار دەکەن، پێشمەرگەکان کە سنوورەکانمان بۆ دەپارێزن و مەترسیی لەسەر هەرێمی کوردستان دوور دەخەنەوە، وە پۆلیس و ئاسایش کە

هێمنیــــی و ئاشـــتیی نێوخــۆ دەپـــارێزن، هـــەموویان شـــایانی دەستخۆشـیی و مایـەی دڵخۆشـیین و بـە چـاوی ڕێـزو حورمەتـەوە تەماشـایان دەكەین، خوا پاداشـتیان بداتەوە، ئەوانیش دەبـێ خۆیـان بە هـی هەموو كەس بزانن، خۆیان بـە هـی هـیچ حیزبێـك نـەزانن، هێـزی پێشـمەرگە، پێشـــمەرگەی ئـەم كوردســـتانەو ئـەم خـاكو وڵاتەیە، وە ئاسـاییش و پۆلیس، وەك هەر كارمەندێكـی دیكە، دەبێ بە یـەك چاو سـەیری هاووڵاتییـانی ئـەم خاكـە بكـەن، ئێمـە بـەوە دەبینـە میللەتێكـی سەركەوتوو، بـەوە سـەر دەكەوین، بـەوە تۆكمـەو دامـەزراو دەبـین، وە هیوادارێشـم ئـەو بڕیارانـەی كـە دراون، بـۆ چاككردنی حاڵو باڵی پێشـمەرگە، زوو جێبـەجێ بكـرێن، وە لای چاكتر بەلای پێشمەرگەدا بكرێتەوە، دوور لـە موزایـەدەی سیاسـیی و حیزبیی، ئەو پێشمەرگانە، ئێمە هەموومان منەتبـارو قەرزداریـانین، هەڵبـەتە خۆشمان هەر بە پێشمەرگە دەزانـین و خۆشمـان پێشـــمەرگە بووین، بەڵام ئەوانەی كە لە سەنگەرەكاندان، بەڕاستیی دەبـــێ بـیری جیددیی بكرێتەوە لە چارسەری گرفت و كێشـەی گوزەرانیان، جێگـەو ڕێگەیان، بەرگ و پۆشاكیان، نان و ئاویان، ماڵ و خێزانیـان، وە ئـەوە هیچ كەس نابـێ بە منەت پێیان بفرۆشـێ، هیچ كەس نابـێ وا بزانـێ كە خێریـان پـێ دەكا، یان پێیـان بڵـــێ: مـن وەك حیزبێـك بۆتـان دەكەم، نا، چونكە خێرو بێری ئەم وڵاتە، هی خەڵكی ئـەم وڵاتەیـە، وە پێشمەرگەكانیش بەشـێكن لە خەڵكـی ئەم وڵاتـــە.

**٨/ كۆتـا برگـەم لـەم تـەوەری یەكەمە، بریتیـە لـە پتـەوكـردنـی ڕیـزەكـانمـان:**

هـەوڵ بـدەین وەك خەڵكـی ئـەم وڵاتـە: خـەڵكی هـەرێمی كوردستان، ڕیزەكانـمان پتەوتر بكەین لە هەموو ئاستەكاندا، ئەویش بـە زاڵكردنـی بەرژەوەنـدیی گشـتی بەسـەر بەرژەوەنـدیی تایبەتـدا، بەرژەوەندیی تایبـەتی، چ وەك شـەخص، چ وەك بنەماڵـە، چ وەك حیزب، چ وەك عەشـیرەت، چ وەك دەڤـەرو شـار، ئێمە با لە فـەزای فراوانی نیشـتیمان پەروەریی و وڵات پارێزیـی و خزمەتكردنی خەڵكدا بـژین، خۆمـان لـە قـاوغ و قـەپێلكی تەسـك نـەئاخنین، وە باتـەنیا خۆمـان و دەوروبەرمـان نەبینـین، بەتایبـەت هەركەسـێك هـەر پۆستێكی هەیـە كە پۆستەكەی پەیوەندیی بە هـەموو خەڵكەوە هەیـە، پێویستە خۆی بـە خزمەتكـاری هـەموو خـەڵك بزانـێ، ئێمـە زۆر پێویستیمان بەوە هەیە كە یەكڕیزیـی خۆمان پتەوتر بكـەین، بەتایبـەت ئەگەر باسی سەربەخۆیی و دەوڵـەت بكـەین، كـە بەتەئكیـد یەكـەمین مـەرجی سـەربەخۆیی و لەسـەر پێـی خـۆ وەسـتان، بریتیـە لـەو یەكڕیزیی و تەباییـە، دوور لە دەمارگـیریی حیزبیـی و . . . هتد.

١) ئامانجمـــان :

براو خوشـكانی بەڕێـز !

بۆ زانینــی ئامانجمان ،سەرنجی هەموو لایـەکتان ڕادەکێشـم بـۆ کــاتی ئیعـــلان کردنــی کۆمــەڵی ئیسـلامیی ، کـــاتی خـۆی گوتـــمان: ئـەم کۆمەڵــی ئیسـلامییە ، درێـژە پێدەری ئەو کـارو خەباتەیـە کـە بزووتنــەوە پێشووەکان ئەنجامیان داوە ، ئنجا ئایا ئامانجمان چی بوو؟

ئامانجمــان ئەوەبوو کە دەبـێ هەر لایـەن و ڕێکخراوێکــی ئیسـلامیـــی لە پێشــاویدا دروست ببـێ : ئەویش ئەوەیە کــە: خـۆی و دەوروبەرەکـەی بەو شـێوەیە لـێ بکا کە جێگای ڕەزامەنـدیی خوا بـێ ، لە ڕووی چاکترو قووڵتر تێگەیشـتن لە دین ، وە لە ڕووی چاکتر پابەند بوونـەوە بـە دیــن ، بۆیە دەبـێ ئێمـە هەمیشـە ئەو ئامانجــەمان لەبەرچاو بێت .

ئنجـا هەندێ کەس کە دەیبیسـتێ ئێمــەی ئیسـلامیی باسی پابەنـدبوون بـە دینــەوە دەکـەین ، دەڵـــێ: ئـەدی کـوا کوردایـەتیی؟ کـوا نیشـتیمان پـەروەریی ؟ کوا خزمەتـی خـەڵك؟

دەڵێین: خزمەتـی خەڵك و ، پاراسـتنی نیشـتیمان و ، پەختـەوەرکردنی کۆمــەڵگا ، ڕووی دووەمـــی مســـوڵمانەتییە ، خـــوای زانـــاو شـــارەزا دەفـــــــەرموێ : ﴿...وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۩ ٧٧﴾ الحج.

واتــە: پەروەردگارتان بپەرستن‌و ،چاكە بكەن ،بۆئەوەی سەرفرازبن.

خوا پەرستیی‌و خەڵك دۆستیی ، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ النحل.

واتــە: بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەدایە ، كە پارێزكارن‌و ئەوانەی ، كـە چاكـەكارن.

تەقـوا لەگـەڵ خوا ، چـاكە لەگـەڵ خەڵكی خوا.

**٢) بنەماكانی كارمان :**

دیــارە ئێمــە لــە بنــەما شــەرعییەكان‌و هێڵــە گشــتییەكانی كۆمەڵــی ئیســلامییدا ، بــە تەفصــیل باســمان كــردوە ، وەمــن لێــرەوە ســەرنجی ئامـادەبووانی كۆنگـرەی سـێ ڕادەكێشـم بۆ بەیاننامـەی كـاری كۆمـەڵی ئیســلامیی كـــە لـــەلاتان هەیـــەو تەماشـــای بكـــەن ، ئێمـــە پێشـــتر وەك ســەركردایەتیی كۆمــەڵی ئیســلامیی لەســەر ئــەو خاڵانــە پێكهــاتووین ، هیوادارم ئێـوەش دەنگیـان لەسەر بدەن ، یان ئەگەر تێبینیتـان لەسـەریان هـەبوو ، دەوڵەمەندیـان بكـەن ، بۆیە من لێرەدا باسی بنـەماكانی كارمـان ناكـەم‌و حەواڵەی نامیلكـەی (بنـەما شـەرعییەكان‌و هێڵـە گشـتییەكانی كۆمەڵی ئیسـلامیی)تان دەكـەم كـە بـە كتێبـی : (ڕوونكردنـەوەی بنـەما شـەرعییەكان . . . ) شـەرحـمان كردوە ، كـەهەتـا ئێسـتا سـێ جـار چاپ كراوە.

**٢ ) كاتی خۆی بۆچی ئۆپۆزیسیۆن بووین، وە چۆن ئۆپۆزیسیۆن بووین ؟!**

ئێمە كاتی خۆی واقیعی هەرێمی كوردستانمان دەبینی ، كە پێویستە دەنگێك هەبێ ڕەخنەگر بێ، چاودێر بێ بەسەر دەسەڵاتەوە، بۆئەوەی چاكسازیی بكاو دەست لەسەر كەمو كوڕییەكان دابنێ، بۆیە ئۆپۆزیسیۆن بوونمان هەڵبژارد، بەڵام چۆن ئۆپۆزیسیۆن بووین ؟

بە نەفەسی خۆمان ، تەنیا تەماشای خاڵە ڕەشەكانمان نەدەكرد، وە تەنیا ڕەخنەگر نەبووین، بەڵكو كە هەستمان دەكرد بە هەستیاریی بارودۆخەكە، هەوڵی ئاشتەواییشمان دەداو هەوڵی یەكدەنگیی و یەكڕەنگیشمان دەدا، ئێمە بە نەفەسی خۆمان موعارەزە بوونمان دەكرد.

باشان كە بەشداری كابینەی هەشت بووین، بۆچی بەشدار بووین؟

گوتمان قۆناغی ئۆپۆزسیۆن بوونمان گوزەراندوە، ئەوەی كە پێویست بووە وەك موعارەزەیەكی ئیسلامییانەی سەرڕاستانە كردوومانە، بە نەفەسی خۆمان بەبێ لاسایی كردنەوەی خەڵك، كە ڕەنگە خەڵكێ بووبێ، كاتی خۆی زۆری تێپەڕاندبێ، ئێستا هەست بەو تێپەڕاندنەی خۆی بكات، بەڵام ئێمە هەوڵمان داوە بە

هاوسەنگیی قسەبکەین، کە ڕەنگە ئەو کاتە ڕەخنە لە ئیعتیدال و هاوسەنگیی ئێمە گیرابێ، بەڵام ئێستا دەرکەوتوە کە ئێمە پێکاومانە، دواییش کە بە پێویستمان زانی، بەشداری کابینەی هەشت بین، چۆن بەشدار بووین هەروا لە گۆترە؟

نەخێر، هاتن بۆ لامان لە هەموو ئاستەکاندا، داوایان لێکردین، ئێمەش کۆمەڵێك مەرجمان هەبوون، مەرجەکانمان بریتیی بوون لە:

چاکسازیی کردن و بە دامەزراوەکردنی کاروباری ئەم وڵاتە، وە دەبێ فۆرخکاریی و بێ عەدالەتیی نەمێنێ، وە گەندەڵیی بنبڕ بکرێ، وە یاسا سەروەر بێ، دەبێ پەرلەمان شوێنی بڕیار بێ، بە شێوەیەکی ڕاستەقینە، وە حکوومەت لە خزمەتی هەموو خەڵکدابێ، ئێمە مەرجەکانی خۆمانمان بۆ دووپات کردنەوە، وە بەڵێنیش درا کە چاکسازیی ڕیشەیی بکرێ!.

بەڵام ئایا ئێستا ئەو حکوومەتە ئەو مەرجانەی ئێمە داوامان کردن و غەیری ئێمەش، وە ئەو بەڵێنەی ئەوان دایانن دەتوانین بڵێین جێبەجێ کراون؟

بە تەئکید، نەخێر، ناشڵێین: هیچ نەکراوە، بەڵام زۆریش لەو بەڵێنانەی کە دراون، کە دەبوو جێبەجێ بکرێن، جێبەجێ نەکراون.

**٤) دەستخۆشییو سوپاسو پێزانین :**

براو خوشکانی بەڕێز ، ئامادەبووانی کۆنگرەی سێیەم !

من لێرەوە بە پێویستی دەزانم دەستخۆشیی بکەم لە هەموو لایەك، ڕێزو تەقدیرم هەیە بۆ هەر براو خوشکێك، چ ئێوە کە تەشریفتان لێرەیە، وەچ براو خوشکانی دیکەتان کە لە دەرەوەی ئەم هۆڵەن، کە ئێمە زیاتر لە دە بۆ دوازدە هەزار ئەندامان هەیە، من دەستخۆشیی لە هەموو لایەك دەکەم، ئێمە بە هەموومانەوە کۆمەڵی ئیسلامیین، وە من لێرەوە ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانەی ئێوە دەکەم، وا مەزانن کارو جموجۆڵی کۆمەڵی ئیسلامیی، تەنها لەسەر شانی سەرکردایەتییە، سەرکردایەتیی بەتەنیا چی پێ دەکرێ، ئەگەر ئێوە هاوکار نەبن؟ وە چی پێ دەکرا، ئەگەر ئێوە هاوکار نەبووبان؟

وە بزانن کە ئەم کۆنگرەیە تەنیا بۆ ئەوە نابەسترێ کە سەرکردایەتییەك هەڵبژێرن و، هەموومان چاو لەو ببڕین، ئاخۆ چی دەکات؟

بەڵکو هەرکامێکمان دەبێ چاو لەخۆی ببڕێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی فێری ئێمە کردوە:

﴿ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ﴾{أخرجه أحمد (٥/٢، رقم ٤٤٩٥)، والبخاري (٨٤٨/٢، رقم ٢٢٧٨)، ومسلم (١٤٥٩/٣، رقم

١٨٢٩)، وابو داود (٣/ ١٣٠، رقم ٢٩٢٨)، والترمذي (٤/ ٢٠٨، رقم ١٧٠٥}، وقال: حسن صحيح.

واتە: هەرکام لە ئێوە چاودێرە و بەرپرسیاریشە بەرامبەر بە خەڵکەکەی خۆی.

بەڵێ نابێ پێمان وابێ، کە کۆنگرە تەنیا بۆیە دەبەسترێ، سەرکردایەتییەکی تازە هەڵبژێردرێ و کارەکان حەواڵەی ئەو بکرێن!

نەخێر، لە ڕابردوودا وا نەبووە، وە لە داهاتووشدا نابێ وابێ، دەبێ ئێمە هەرکامێکمان خۆی بە ئەندامێکی سەرکردایەتیی و مەکتەبی سیاسیی بزانێ، وەهەر کامێکتان خۆی بە کەسی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی بزانێ، هەست بە بەرپرسیارێتیی بکا، ئێنجا کارمان ڕێكو ڕاست دەبێ.

دەستخۆشی لە هەموو ئۆرگانەکان دەکەم، ناوی کەس ناهێنم تاکو کە ناوی ئۆرگانێکم لەبیر چوو، گلەیی نەکات، دەستخۆشیی لە هەموو لایەك دەکەم، زۆر سوپاستان دەکەم، کۆمەڵی ئیسلامیی پێتان سەربەرزە، شتی خۆتان بەکەم مەزانن، ئەو ئاستەنگانەی هاتوونەتە بەردەم کۆمەڵی ئیسلامیی، ئەو هەورازو نشێوانەی ئێمە بڕیومانن، ڕەنگە خەڵکی دیکە نەتوانن بیانبڕن، خەڵکی دیکە هەیە بە زەبری پارەو ئیمتیازی مادیی، خەڵکی لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە، ئێمە بە دەست بەتاڵیی بە هەژاریی و نەداریی و بە لێقەوماویی بە زوڵم

لێکراویی‌و بە مەحرووم کراویی، لەم وڵاتەدا توانیومانە ئەو ڕابردووەی پێشوو بگوزەرێنین، وە بە تەئکید ئێستاو داهاتووش إن شاء الله باشتر ڕێ دەکەین، شتی خۆتان پێ کەم نەبێ، من کە تەماشای ئەندامان‌و کادیرانی خۆمان دەکەم، وا لێبڕاوانەو دڵسۆزانە بە دەستی خاڵیی لە کارو چالاکیی ئیسلامییانەو خەڵك دۆستانەی خۆیان ناوەستن، لە حاڵێکدا کە ناسیاوو نیزیك‌و دراوسێکانی ئەوان، کە لەگەڵ لایەنێکی دەسەڵات دان، تەمەتتوع دەکەن بە ئیمتیازی ماددیی‌و مەعنەویی، زۆرو زەوەندی بە هەق‌و بە ناهەق، بەڵام خۆیان لێی بێبەشن، کەچی ئەوە ساردیان ناکاتەوە، بۆچی؟!

چونکە ئێمە پێش ئەوەی خەڵك ببینین، خوا دەبینین، پێش ئەوەی دنیا ببینین، دوارۆژ دەبینین، بۆیە من داوا لە هەموو خوشك‌و برایان دەکەم، کە لەمەودوا گرنگیی زیاتر بدەین بە: (کاری ڕێکخستن) ڕێکخستن ڕەگ‌و ڕیشەی کارە، ئەو ڕەگ‌و ڕیشەیە کە بوون‌و قەبارەی ئاشکرای حیزب لەسەری دەوەستێ، وە گرنگیی زیاتر بدەین بە هۆنینەوە، بە تێگەیاندن‌و پێگەیاندن، بە بێداریی‌و هۆشیاریی لە هەموو ڕوویێکەوە.

## ٥) کـاری خوشـکـان :

خوشـکانمان نیـوەی ئێمــەن، خوشـکانی بەرێزمــان، دایکــانی بەرێزمان، کچـە خۆشەویستەکانمان، دەبێ بە چـاوی ڕێـزو حورمەتــەوە تەماشـای کاریان بکەین، دەبـێ دڵخۆش بین بە کارو چالاکییەکانیـان، من زۆرجار گوتوومـە: هـەتا خوشـکێك بەقــەدەر برایـەك کـار دەکـا، دەبـێ دوو هێنـدەی ئەو ماندوو بـێ، بۆیە من لێرەوە بە هەموو ئەنـدامانی کـۆنگرە ڕادەگەیـەنم: دەسـتیارو هاوکـاری خوشـکەکانتان بـن، هـەر کۆمەڵگـایەك ئافـرەت تێیدا کاریگەرو کارا نەبـێ، وە بـواری بێتـەدریٚ و ڕێـی بێ نـەدرێ، کۆمەڵگـایەکی لاتـەڵ و لاسەنگ دەردەچێ.

کێ جیـل بـێ دەگـەیەنـێ؟ وەك (حافظ إبراهیم) دەڵــێ:

والأُمُّ مَدرسـةٌ إن أَعْدَدْتَها أَعددْتَ شَعْباً طَيِّبَ الأَعـراقِ

کـێ منـداڵ بـێ دەگەیەنـێ؟ کــێ جگەر گۆشـەکان بێ دەگەیەنێ؟ کــێ دەبێتـە هۆ کـاری ئەوە کـە هاوکـاری پیـاو بــێ؟

ئــافرەت، ئـافرەت زۆر ئـەرکی گـەورە گـەورەی لەسـەر شـانە، ئافرەتـان و پیـاوان کۆمــەڵێك ئـەرکیان هـەن، هاوبەشــن، لـە زۆربــەی ئەرکەکـانـدا هاوبەشن، وە ئافرەتـان کۆمەڵێك ئەرکی تایبەت بـە خۆیـان هـەن، وەك چۆن پیـاوان کۆمەڵێك ئــەرکی تایبــەت بـە خۆیـان هـەن، بـەڵام لــە زۆربــەی ئەرکەکانــدا هاوبەشــن، وەك خــوای بــەروەردگار

دەفـــەرموێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾ التوبة.

واتە: پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار هاوکارو پشتیوانی یەکدین، سەرپەرشتیاری یەکدین، {(أَوْلِيَآءُ) کۆی (وَلِيٌّ)، واتە: سەرپەرشتیار، هاوکار، خۆشەویست، دۆست}، فەرمان بە چاکە دەکەن، ڕێگریی لە خراپە دەکەن، نوێژ بەرپا دەکەن، زەکات دەدەن، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن، هەر ئەوانەش خوا بەزەیی پێیاندادێ، بێگومان خوا زاڵی کارزانە.

### ٦) قوتابیانمان و گەنج و لاوەکانمان:

پێویستە گرنگیی زیاتر بدەین بە پێگەیاندنیان، ئەمڕۆ چینی گەنج و لاومان لەژێر فشارێکی زۆردان، لە ڕاگەیاندنەکانی تەوژمی سیکۆلاریزمەوە، خەڵك بەرەو فەسادو داڕووخانی ئەخلاق دەبەن، بەداخەوە لەم وڵاتەی خۆماندا لایەنی سیاسیی وا هەیە، مەداری بە خەڵکێکی ڕەوشت داڕووخاو ساز دەبێ، بۆیە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی

خەڵك ئاراستە دەکەن، بۆ ئەوە کە ئاگایان لە ڕەوشتو بەها بەرزەکان نەمێنێ، ئاگایان لە خواو قیامەت نەمێنێ، بۆیە لەوبارەوە ئێمەی ئیسلامیی، ئەرکی سەرشانمان زۆر قورسە.

## ٧) بانگەوازو پەروەردە :

پێویستە لەمەودوا گرنگیی زیاتر بدەین بە بانگەواز، بە پەروەردە، بە خۆپەروەردە کردنەوە، لە ڕووی: ئیمانیی، ڕووحیی، ئەخلاقیی، فیکریی، ئیداریی، وە بە زیاتر چوونە نێو خەڵكو بەرچاو ڕوون کردنەوەی خەڵكو کۆمەڵگا، من دڵنیاتان دەکەمەوە: ئەگەر ئەو خەڵكو کۆمەڵگایە وەك ئێمە لە ئیسلام تێبگا، ڕەنگە لە ئێمە چاکترو دڵسۆزتر بن، با گومانی خراپ بە خەڵك نەبەین، خەڵکێك کە بەدوای غەیری ئیسلام کەوتوە، لەبەر ئەوەیە کە لە ئیسلام تێنەگەیشتوە.

بەڵێ، دەشزانم خەڵکێکیش هەیە تێدەگا، بەڵام بەرژەوەندیی لەوەدایە بەدوای غەیری ئیسلام بکەوێ، بەڵام زۆربەی خەڵك بە خۆشمانەوە، باش لە ئیسلام تێنەگەیشتووین، دەبێ کاری زیاتری بۆ بکەین.

## ٨) تەبایی و یەکڕیزیی نێوخۆمان :

سوپاس بۆ خوا تەبایی و یەکڕیزیی و خۆشەویستیی لەنێوماندا و لە هەموو ئاستەکاندا هەیە، بەڵام دەبێ زیادی بکەین، ئێمە لە خوا بەزیاد بێ تەبایین و یەك ڕیزین و مەحەببەتی زۆر هەیە، بەڵام پێویستی بە زیاتر قووڵ بوونەوەو ئاگا لێبوون هەیە، زیاتر چاودێریی بکەین، با کۆمەڵی ئیسلامیی بوون، بکەینە سەنگی مەحەك، نەك ئینتیما بۆ شارو بۆ ناوچەو بۆ عەشیرەت و بۆ خەباتێکی پێشوو، بە عینوانێکی دیکە، ئێمە بڕیارمان داوە کۆمەڵی ئیسلامیی بین، ئینتیما بۆ کۆمەڵی ئیسلامیی، سەنگی مەحەکە.

پاشان دەبێ ئاگامان لێبێ: خاوەن بڕوانامەو بێ بڕوانامە، یان ئەوە بەتەمەنەو، ئەوە کەم تەمەنە، ئەو ئیعتیبارانە دەبێ لێیان بەئاگا بین، ئێمە پێویستمان بە خەڵکی بەتەمەن و بە ئەزموون هەیە، وە پێویستیمان بە گەنجی بە حەماسەت و خوێنی گەرمی تازەش هەیە، لە هیچیان بێ نیاز نین، دەبێ تەواوکەری یەکدی بین، وە دەبێ هەمووشمان شان بدەینە بەر کارەکان، هەندێکمان بۆ هەندێکی دیکەمان لێیان نەگەڕێین.

**٩) گۆڕانکـاریی و چاکسـازیی، بەردەوام پێویسـتە :**

کـە ئێمــە بەتەمــاین لـەم کۆنگرەیـەوە گۆڕانکــاریی بکـەین و دەبـێ خۆمانی بۆ سـاز بکـەین، گۆڕانکاریی لە چیـدا ؟

خوشـك و برایـان !

خۆتـان ئاگـاداری وەزعـی دارایـی هـەرێمی کوردسـتان هــەن، وە کۆمەڵی ئیسـلامییش بەتایبـەت، بۆیە ئێمــە هـیچ چـارمان نیـە، دەبـێ بەرەو سـادە ژیان بڕۆین و، بـەرەو کـەم کردنـەوەی مەسـرەف بـڕۆین، بەرەو قەنـاعەتی زیاتر بچین، بـۆ ئـەوەی بتـوانین درێـژە بـە کارەکانمـان بدەین، پێشـتریش بە قەناعـەت بووین و سـادە ژیاوین، بەڵام دەبێ ئـەو خاڵە زیـاتر ئاگامان لێـی بـێ، دەبـێ بارەگاکان کەم بکەینـەوە، بـەڵام هەوڵ بدەیـن دڵی هەر کامێکمـان بنکەیـەك بـێ، بـۆ کـارو پـڕۆژەی ئیسـلامیی، عەقڵی هەر کامێکمـان بنکەیـەك بـێ و، کـاری ئیسـلامیی نابـێ لەسەر چـوار دیوارێـك پەکی بکـەوێ ! .

**١٠) بە نسبەت چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کارەکانی کۆنگرەوە :**

سەرەتا دەستخۆشیی گەرم لە لیژنەی باڵای ئامادەکاریی کۆنگرە دەکەم ، وە هەموو لیژنەکانی دیکە کە پێم وایە سەرکەوتووانە کۆنفرانسەکانیان بەستن ، وە پیرۆزبایش دەکەم لەو برا بەڕێزانەی بوونە بەرپرسی مەڵبەندەکان ، وە ئومێدەوارم ئەوان بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی برا پێشووەکانیان ، کاری خۆیان چاکترو دەوڵەمەندتر بکەن ، کۆمەڵی ئیسلامیی توانیی یازدە (١١) کۆنفرانس بگرێ ، یازدە ئەندامی سەرکردایەتیی ئێستا لەنێو ئەم کۆنگرەیەدان ، ئەوەش سەرکەوتنێکی گەورە بوو ، بەبێ کێشەو مشت و مڕێك کە شایانی باس بێ کۆنفرانسەکان بەستران .

هەڵبەتە وتوویژو موناقەشە کاتێك لەنێو کۆنفرانسدا دەبێ ، ئەوە نیشانەی زیندوویێتیی خەڵکە ، بەڵام لە چوارچێوەی ئەدەب و ڕێزلێگرتن و دڵ ڕاگرتنی یەکدی و ، ئەو ڕەوشت و ئەدەبانەدا کە ئیسلام فێری کردووین .

ئنجا ئێمە بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانی کارەکانی کۆنگرە ، پێویستە بەرپرسانە مامەڵە بکەین ، وە ئیجابییانە قسە بکەین ، پێشنیار دەکەین تێبینی دەخەینە ڕوو ، ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی خەڵکی خۆمان هەر ئاوا عادەت داوەو وامان ڕاهێناون ، وە ئەوەش بەڕاست دەزانین ،

بوار هەیە بۆ ڕاجیایی، بۆ ئیختیلافی سەلیقە، ئێمە بەڕاستی ناتوانین خەڵکی هەموو لەیەك قاڵب بدەین، لەو شتانەدا کە ڕاجیایی هەڵدەگرن، لەو شتانەدا کە بیرو بۆچوونی جیا جیا هەڵدەگرن، هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ، زۆر زۆر لە ئێمە چاکتر بوون، بەڵام نەیانتوانیوە ڕاجیا نەبن، ئەبو بەکرو عومەر، عوسمان‌و عەلی خوا لێیان ڕازی بێ، نەیانتوانیوە ڕاجیا نەبن، لەو مەسەلانەدا کە دەقیان لەسەر نیەو، دەق بەکلایی نەکردوونەتەوە، ئێمەش ئەگەر لەگەڵ یەکدا ڕاست بکەین، ناتوانین لەگەڵ یەکدی ڕاجیا نەبین، بەڵام با دڵمان جیا نەبێ، خوای کاربزان باسی یەیەکەوە جۆشدانی دڵەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ... ﴿٦٣﴾ ﴾ الأنفال.

نافەرموێ: (والف بَيْنَ عقولهِم)، با ئێمە دڵمان یەیەکەوە بێ، با ڕامان جیا بێ، با بۆچوونمان جیا بێ، بەڵام با دڵەکان بەیەکەوە پەیوەست بن، هیچ کەسێ ئەوی دیکە تۆمەتبار نەکات، کە خۆی لەو مسوڵمان ترە، یان لە بەرامبەرەکەی دڵسۆزترە، دەبێ حەقمان بەسەر نییەتی یەکدییەوە نەبێ، ئێمە مامەڵە دەکەین لەگەڵ ڕواڵەت‌و ئاشکرای یەکدیدا، بڵێ: ئەو قسەیەی تۆ بەو بەڵگەیە هەڵەیە، بەڵان حەقم بەسەر دڵتەوە نیە.

وە داوا دەکەم هەموو لایەك بە باشیی پابەند بین بە ئاراستەکانی لیژنەی ئامادەکاریی کۆنگرەوە.

ئەو فەرمایيشتە بە پێزەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەخەمە بەرچاوی هەمووتان، دەفەرموێ: ﴿اتَّقِ اللَّهِ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعْ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ﴾ {أخرجه أحمد برقم (٢١٣٩٢)، والترمذي برقم (١٩٨٧) وقال: حسن صحيح، والدارمي برقم (٢٧٩١)، والحاكم برقم (١٧٨) وقال: صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي، والبيهقي في شعب الإيمان، برقم (٨٠٢٦)، وأخرجه أيضًا: البزار، برقم (٤٠٢٢) وأبو نعيم، في الحلية، برقم (٣٧٨)}، قال الألباني: حديث حسن، قال شعيب الأرنؤوط : حسن لغيره.

واتە: لە هەر شوێنێك هەی، لە هەر حاڵێكدا هەی، پارێز لە خوا بكە، {پەیوەندییت لەگەڵ خوادا لەسەر تەقوا بنیات بنێ}، وە بەدوای خراپەدا چاكە بكە دەیسڕێتەوە، {پەیوەندییت لەگەڵ خۆتدا لەسەر ئەوە بنیات بنێ كە لە خۆت وریا بی، خراپە نەكەی، كە كردت بیسڕەوە، هەمیشە خۆت خاوێن ڕاگرە، پاك بە، دەروودەروونت پاك بێ، لەگەڵ خواو خەڵكدا پاك بە}، وە لەگەڵ خەڵكیشدا بە ڕەوشتی جوان مامەڵە بكە.

خوشك و برا بەڕێزەکانم!

**یەکەم: پەیوەندیی لەگەڵ خوادا: کە لە (تقوی)دا بەرجەستە دەبێ:**

١) بەر لە هەموو شتێك پەیوەندیی لەگەڵ خوادا پێویستی بە زانیاریی و بەرچاو ڕوونییە، دینداریی بە شارەزایی و بەرچاو ڕوونیی دەکرێ، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) کە نەخوێندەوار بووە، دەفەرموێ: ﴿ اقْرَأْ ﴾، لە یەکەمین وشەیدا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو بخوێنە!.

هەروەها خوای کاربەجێ پێی دەفەرموێ:

﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد.

واتە: بزانە! کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە.

بۆیە لێرەوە لێتان تەئکید دەکەمەوە، کە هەرچی زووترە شارەزا بن، لە قورئان و سوننەتدا، لە شەریعەتدا، ئیکتیفا بە ڕاو بۆچوون و ئیجتیهادەکانی زانایانی پێشوو ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ، مەکەن، ئەوان وەڵامی پرسیارەکانی ڕۆژگاری خۆیانیان داوەتەوە، ئێمەش مولزەمین بە تەماشا کردنەوەی دووبارەی قورئان و سوننەت، وەڵامی پرسیارەکانی ڕۆژگاری خۆمان بدەینەوە، ئەو

پرسیارانەی کە لە ڕۆژگاری ئەواندا هەر خەونیشیان پێوە نەبینیون، تاکو وەڵامیان بدەنەوە، با ئێمە لە مێژوودا نەژین و لە واقیعدا بژین، بەڵام بە پشت بەخۆ بەستن، وە لەسەر پێی خۆ وەستان، نەك لاسایی کردنەوەی خەڵك.

٢) پێویستیمان بەوە هەیە کە بەردەوام ئیمانمان نوێ بکەینەوە: هاوەڵان کە دەگەیشتن بەیەکدی بەیەکێکیان دەگوت: وەرە با ئیمان بێنین و ئیمان نوێ بکەینەوە، دەبێ هەمیشە ئاگامان لەو هۆکارانە بێ کە ئیمان بەهێز دەکەن، وە ئەو هۆکارانەی ئیمان بێهێز دەکەن، زانایان دەڵێن:

(الإيمانُ يَزيدُ ويَنقُص، يَزيدُ بالطّاعة ويَنقص بالمَعصية).

کەواتە: با لە تاعەت زیاد بکەین، تاکو هەمیشە ئیمانێکی گەرم و گوڕو تازەمان هەبێ، وە با ئاگامان لە گوناح و سەرپێچی بێ.

٣) دەبێ ئاگامان لە ئیخلاص و تەنیا خوا بێ مەبەست بوون بێ.

براو خوشکەکان!

بەبێ ئیخلاص ئینسان هیچی دەستگیر نابێ و دەبێتە سەبانی بووشی و لە قیامەت دا ڕەنجەڕۆ دەبێ، ئاگاتان لە خوا بێ

مەبەست بوون بێ، بۆ هەر قسەیەك كە دەیكەن، وە هەر ڕەفتارێك كە دەینوێنن، پێشی خوا ببینن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ۝٥ ﴾ البينة.

واتە: فەرمانیان پێ نەكراوە، مەگەر بەوە كە بە ساغیی بەندایەتیی بۆ خوا بكەن.

٤) ئاگامان لە وردتێگەیشتنی ئیسلام و قورئان و سوننەت بێ، با سەركێڵ و ڕووكەش بین نەبین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ﴾ {اخرجه احمد، برقم (١٦٨٨٥)} قال الشيخ شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح.

واتە: هەركەسێ خوا خێری بۆی بوێ، لە دیندا شارەزای دەكا.

جیاوازیی پێشەوایانی ئێمە لەگەڵ خەڵكی دیكەدا، كە لە سەردەمی ئەواندا بوون، چییە؟

بێگومان یەكەمین جیاوازیيان ئەوەبوو كە پێشەوایانمان باش لە دین تێگەیشتوون، عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس پێغەمبەری خاتەم

(صلی الله علیه وسلم) دوعای بۆ دەکا دەفەرموێ:

﴿اللهُمَّ عَلِّمْهُ الْكِتَابَ﴾ {أخرجه البخاري، برقم (٧٢٧٠)}.

واتە: ئەی خوایە! لە کتێبی خۆتدا زانای بکە.

ئێمەش دەبێ قوول‌و وردلە ئایین حاڵی بین، زۆربەی ئەوانەی کە ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن، بەهۆی هەڵەو پەڵەو کرج‌و کاڵیی مسوڵمانانەوەیە، کە باش لە دینەکەیان تێنەگەیشتوون.

٥) با پشتیشمان بە خوا قایم بێ‌و پشت بە خوا ببەستین:

﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١٦٠﴾ آل عمران، لە هەڕەشەو گوڕەشە مەترسن، هەندێ براو خوشك، هەندێ کەس پێی وایە کە تۆ مادام بە ڕێی خوادا دەڕۆی، نابێ ناخۆشییت بێتە ڕێ، نابێ کەس بڵێ: ماڵت لە کوێیە؟

نەخێر، ئێمە بەو بڕیارە دینداریی‌و خوا پەرستییمان دەست پێ نەکردوە، ئێمە ئەگەر لە جەنگ‌و جیهادیشدا نەبین، دەبێ هەمیشە فیداکاربین، داواتان لێ دەکەم ڕووحی فیداکاریی‌و خۆبەخت کردن، هەمیشە بە گەرم‌و گوڕ ڕابگرن، ئیسلام تەنیا کەسانێك دەتوانن تا سەر لەگەڵیدا بڕۆن، کە ئامادەبن

سەروماڵیان لە پێناوی دا بەخت بکەن، مەرج نیە تەنها لە سەنگەر دابی: دەگیرێی، دەکوژرێی، مەحرووم دەکرێی، دەبێ دڵ فراوان و بار قوورڵ و بە حەوسەڵە بی، دەبێ بێباك بی، خوای پەروەردگار باسی ئەوانە دەکا کە دەیانهێنێ بۆ ئەوەی دینی خۆیان پێ بپووژێنێتەوە، ئاوا وەسفیان دەکا:

﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ﴿٥٤﴾ ﴾ المائدة

یەکێ لە سیفەتەکانیان ئەوەیە کە لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن.

**دووەم: پەیوەندیی نێوان خۆمان:**

براو خوشکەکانم!

خوا هەمیشە کە باسی پەیوەندیی نێوان خۆمان دەکا، پێشێ باسی تەقوا دەکا: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ﴿١﴾ ﴾ الأنفال،

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ النحل،

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴿١٢٥﴾ ﴾ النساء.

كەواتــە: بەیەكـــەوە چـــاك بوونمـــان، بـــراو خوشـــكی بۆیـــەك بـــاش بوونـمان، بەرهەمی بۆ خـوا صـــوڵحانمانە، ئەگـەر بـۆ خـوا صـوڵحاو بین، بەیەكـەوە براو خوشـكی چـاك دەبین، هەر خەلـەل و تێكچـوونێك لە پەیوەندییـەكـانماندا هـەبـێ، دەبێ چاو بگێڕینـەوە بـە پەیوەندییمــان لەگـەڵ خوادا.

پێشـــینان جوانیـــان گوتـوە: {لـەو كەسـە بترســـێ، كـە لـە خـوا ناترسـێ} ئەگـەر وەك عەبدولقـادری گەیلانیـی دەڵـێ:

{صِدقٌ مَعَ الحَق، خُلُق مَعَ الخَلق}.

لەگەڵ خوادا ڕاسـت بی، لەگـەڵ خەڵكدا چاك دەبی.

دەبـــێ كـــار لەســـەر خۆمـــان بكـەین، لــە پەیوەندییـەكـانی نێـوان خۆماندا، ڕێزو حورمـەت لە یەكـدی بگـرین، هیچ كـەس خـۆی پـێ لەوی دیكـە چاكتر نەبـێ، یەكـێ لـە سیفەتەكانی مسـوڵمان كـە خـوا فەرمانـی پـێ دەكـا ئەوەیـە، كە دەفـەرموێ:

﴿ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢ ﴾ النجم.

واتـە: خۆتـان بە پاكـو چاك مەزانن، هـەر ئـەو (خـوا) دەزانـێ كـێ پارێـزی كردوە.

بەکێ تەقوا لەوەدا دەبینێ بەو شێوەیە دینداریی بکا ، بەکێکی دیکە تەقوا لە شتێکی دیکەدا دەبینێ ، تەقوا زۆر شوێنەواری هەن، تەقوا لە شتێك‌و دوو شتدا کورت نەبۆتەوە، جاریێ ڕیشەی تەقوا لە دڵدایە، بەڵام شوێنەواری لەسەر ئینسان دەردەکەوێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکدا ، سێ جاران ئاماژەی بە سینەی موبارەکی کرد، فەرمووی:

﴿التَّقْوَى هَاهُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ﴾ {اخرجه الترمذي، برقم (١٩٢٧) وقال: حسن غريب، واخرجه ايضًا: احمد، برقم (٨٠٨٩)}.

هاوەڵانی بەڕێز وابوون خوا لێیان ڕازی بێ، بەکیان لە مەیدانی جەنگ‌و جیهاددا، ئەوی دیکەیان لە مەیدانی عیلمدا، ئەوی دیکە لە مەیدانی کۆمەڵایەتییدا، ئەوی دیکە لە بواری عیبادەتی کەسییدا، ئەسپی خۆی تاوداوە، وە دەبێ ئێمە هیچ براو خوشکێکمان بێ زیادنەبێ، ئەو براو خوشکانەی کە بێیان کراوە هاتوونە کۆنگرە بەخێر بێن سەرچاوو، ئەوانەی بۆیان نەکراوە، بێن، چ وەك بەرنەسیبی حیزبیی نەگونجاوە بێن‌و هەڵنەبژێرراون، یان دیاریی نەکراون، یاخود عوزرێکیان هەیە، یان هەر نەهاتوون لەبەر هەر هۆیەك بێ، هەر براو خوشکی خۆمانن، ئێمە هەموو پێکەوەین پێکەوە جوانین، پێکەوە مەعنا دەدەین، ئینسان کە ڕستەیەك دێنێ،

لە زمانی کوردیدا : کردارو ناوو پیتی ، تێدانو هەموویان پێکەوە مانا دەبەخشن ، جاری وا هەیە ڕستەیەکی درێژ ، یەکی لەسەر پیتێك دەکەوێ ، ئێمەش هەموومان بە یەکەوە جوانین ، کەسمان بێ زیاد نیەو ڕێزو حورمەتمان بۆ هەریەکێکە لە شوێنی خۆیدا .

براو خوشکەکان !

ئێمە بەبێ یەکدی قبوولّ کردن بە تایبەتمەندییەکانی یەکدییەوە ، ناتوانین بەردەوام بین ، دەبێ یەکدیمان بە تایبەتمەندییەکانەوە قبوولّ بێ ، وە شتێك کە لە چاوی مندا کەم و کورییە ، ڕەنگە لە چاوی خۆتدا شتێکی باش بێ ، وە ڕەنگە تۆ کەم و کورییەك لە مندا ببینی ، من لەلای خۆمەوە پێم باش بێ ، گرنگ ئەوەیە ئێمە بە میزاج بە یەکەوە ڕەفتار نەکەین ، تەرازوو قورئان و سوننەت و شەریعەتە ، نابێ هیچ کەس بەتەما بێ ، هەمووان پێنە سەر ئەو میزاج و مەشرەبەو مەسەلەکەی کە ئەو لەسەریەتی ، هاوەڵان کە باشترین جیلی مسوڵمانانن ، وا نەبوون ، خوا بە کەسی نەفەرمووە : لێیان ڕازیم و ڕازیشیان دەکەم ، بە هاوەڵان نەبێ ، کەچی دەبینین یەکێ لای زوهدی زیاتر گرتوە ، ئەویدی عیبادەتی تاکەکەسی ، ئەوی دیکە لای عیلم و مەعریفەت . . . هتد ، هەر کامێکیان لە قوڵی خۆیەوە ڕۆیشتووەو بە هەموویان ئەو بینایەی ئیسلامییەیان بنیات ناوە ، کە ئێستا ئێمە خۆمانی تێدا دەبینینەوەو ، خۆمان بە درێژە پێدەری دەزانین .

باشان ئەگەر زۆر لێكردن لە دیندا نەبێ، لە بیروڕاو مەزهەبو ئیجتیهاددا هەر نیە، برایەك خۆشكێك بۆچوونێكی هەیەو پێی موقتەنیعە، دەبێ مەجالی بێ بدەین، وە بۆ ساغ كردنەوەی ڕایەكان، دەبێ وتوویژ بكرێ، وە هەركەسێ حەقی كەوتە بەرچاو دەمارگیریی و نیەتی پێش وەخت، ڕێی لێ نەگرێ، وەری بگرێ .

**سێیەم: پەیوەندییمان لەگەڵ خەڵك دا:**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

﴿وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ﴾

لەگەڵ خەڵكدا خۆش ڕەفتاربە.

خوای پەروەردگار پێمان دەفەرموێ:

﴿ وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ ﴾ البقرة، چاكە بكەن، خوا چاكەكارانی خۆش دەوێن.

لەگەڵ كێدا چاكە بكەین ؟

لەگەڵ هەموو خەڵكدا، ﴿ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴿٨٣﴾ ﴾ البقرة.
شتی چاك بە خەڵكی بڵێن، هەروەها دەفەرموێ:

﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الإسراء.

بە بەندەكانم بڵێ: كامە قسەی باشترە، با ئەوە بكەن.

من لێرە داوا دەکەم لە هەر براو خوشکێك، وە پێشی ئامۆژگاریی خۆم دەکەم، کە ئاگامان لە زمانمان بێت، ئاگامان لە تەعبیرەکانمان بێ، هەڵبەتە پێش ئەوە ئاگامان لە دڵو دەرونمان بێ، نەك تەنیا لەنێو خۆماندا، لەگەڵ خەڵکیشدا، پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ لەگەڵ خەڵکدا دڵسۆز بوون، (هود) علیە السلام بە گەلی (عاد) دەڵێ:

﴿وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾ الأعراف.

من بۆ ئێوە ناصیحێکی ئەمینم.

(ناصح) یانی: دڵسۆز، زانایان دەڵێن: (النصح: هو إرادة الخیر للمنصوح).

(نصح) بریتییە لەوە کە ئەو کەسەی قسەکەی ئاڕاستە دەکەی، چی بۆ ئەو چاکە، ئەوت بوێ، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی:

«الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قَالُوا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ» {اخرجه الترمذي، برقم (١٩٢٦)، وقال: حسن صحيح، والنسائي، برقم (٤١٩٩)}.

واتە: دینداریی دڵسۆزییە، گوتمان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: بۆ خوا، {بۆ خوا دڵسۆزیە بە ساغیی لەگەڵ خوادا مامەڵە بكە}، وە بۆ كتێبی خوا {لەگەڵ قورئاندا ڕاستو ساغ بە، هیچ ئەمرو فەرمانێكی قورئان ڕەت مەكەوەو هەوڵ بدە پاشی تێبگەی، ئەوە دڵسۆزییە بۆ قورئان} وە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وە بۆ كاربەدەستانی مسوڵمانان، وە بۆ خەڵكی بە گشتی.

لە كۆتاییدا دەڵێم:

ئومێدم وایە ئەم كۆنگرەیەی سێیەمی كۆمەڵی ئیسلامیی، كۆنگرەیەك بێ، تێیدا دەست بخەینە سەر كەمو كوڕییەكانی ڕابردوومان، بەڵام ئاگامان لەخۆمان بێ: ستەم بۆخۆمان نەكەین، وە لەگەڵ خۆشماندا بێ ئینصاف نەبین، دەست بخەینە سەر كەمو كوڕییەكانمان بۆ چاك كردنیان، نەك بۆ خۆ نائومێد كردن، وە بەرەو ئایندەیەكی ڕۆشن بڕوانین، بەڵام زەرب بەسەر ڕابردووی خۆماندا نەهێنین، وە زەرب بەسەر ڕابردووی كەسدا نەهێنین، ئێمە وەك زنجیرێكین كە لە چەند ئاڵقەیەك پێك هاتوە، ئەم ئاڵقەیەی ئێستا تێیداین، ئاڵقەكانی پێشیی لێبكەوە، زنجیر نامێنێ، یەك ئاڵقە دەمێنێتەوە، ڕابردووەكەمان ئێستامانی لێكەوتۆتەوە، ئێستاشمان داهاتوومانی لێ دەكەوێتەوە، بە ئومێدی ئەوەی لە ڕابردوودا چی چاكمان كردوە، چاكتری بكەین، وە چ كەمو كوڕیی و

خەلـەلێکمـــان هەیــە، دەستی لەســەر دابنێـین، وە چارەسـەری بـۆ دابنـێن، وە بۆ داهـاتووش پلانو نەخشـەیەکی چـاك دابنێین، کـە ئێمـە ئەم کۆمـەڵی ئیسـلامییە زیـاتر بکەینـە جێـی ئومێدەوار بـوونی خـەڵکی هەرێمـــی کوردســـتان، زیـــاتر وای لێبکـــەین بچێتـــە عـــەقڵو دڵـــی خەڵکـەوە، ئەو ئامانجـانەی کە کۆمەڵی ئیسـلامیی لەبەرچاوی گرتوون، ئەو ئامانجـانە باشـتر جێبـەجێ بکـەین، وە بە تەئکیـد ئـەو ئامانجـانەی ئێمە هەمانن، کـە شـەریعەت سـایەو سێبەری خـەڵك بـێ، دادگـەریی بچەسپێ، تـەبایی هـەبێ، گەنـدەڵییو قۆرخکـاریی نەمێنـێ، ئـەوە بـە هەمووومـان دەکـرێ، با خەڵکی قەناعەت پـێ بێنین، زیـاتر لەگەڵمانـدا هاوکـارو دەسـتبارگر بـن، بۆ هێنـانەدی ئەو ئامانجـە گەورەو گرنگـانە.

سُبْحَانَک ربّک ربّ العزّة عمّا یَصِفون وسلام علی المرسلین والحمد لله ربّ العالمین.

